زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان (7)

# گاندی

مالْکۆڵم یاپ

و: ئاگری ئەفشین



2017

زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان (٧)

ناوی کتێب: گاندی

نووسەر:ماڵکۆڵم یاپ

لە ئینگلیزیەوە: ئاگری ئەفشین

چاپ: ئەلیکترۆنی

ساڵ: ٢٠١٧

# ناوەڕۆك




خۆڵەمێشی گاندی بەرەو ڕوباری گەنگ

## پێشەکی:

درەنگانی ئێوارەی ڕۆژی ١٩٤٨/١/٣٠ بوو. لە ڕۆژێکی جوانی زستانی شاری دهلی. لە باخچەکەدا دەنگەدەنگی جەماوەرێك دەهات کە گوێیان بۆ پیرەپیاوێکی نەخۆش گرتبوو. کەسێکی شەکەت و ماندوو بوو کە توانای ڕاوەستانی نەبوو بۆیە خۆی دابووە سەر شانی دوو کچ. ماندوو بوو بە هۆی کاری زۆر و بە ڕۆژوبونێکی زۆر. کەسێکی گەنج لە ناو جەماوەرەکە هاتە دەرەوە و لە پیرەپیاوەکە نزیك بوویەوە، سەرەتا سەری ڕێزی بۆ دانەواند و دواتر سێ گولەی نا بە سەر سینگیەوە و پیرە پیاوەکەی کوشت.

ئەو پیرەپیاوە ناوی گاندی بوو، کە خۆشەویسترین کەس بوو لە هیندستان. ئەو پیاوەی توانی سەربەخۆیی و ئازادی بگێرێتەوە بۆ هیندستان لە دەست بەریتانیا. ئەدی ئەو گەنجە کێ بوو؟ هەندێ وتیان کەسێکی موسڵمان بوو کە ڕەقی لە گاندی بوو چونکە گاندی ڕێبەری هیندوەکان بوو. ئەگەر ئەو پیاوکوژە بە ڕاستی موسڵمان بوایە، ئەوا نەك هەزاران بەڵکو ملیۆنان موسڵمان لە تۆڵەی گاندی دەکوژرانەوە. بەڵان لە ڕاستیدا ئەو گەنجە هیندو بوو، ئەو تەقەی لە گاندی کرد چونکە ئەو پێی وابوو ئەو خیانەتی کردووە لە هیندستان و هیندووەکان بە هۆی دابەش کردنی وڵات لە گەڵ موسڵمانەکان.

مەرگی گاندی کۆتایی بە سەرکەوتن و شکستەکانی هێنا. گاندی ڕێبەرایەتی هیندستانی کرد بەرەو ئازادی و سەربەخۆیی، بەڵام نەیتوانی بەر لە



پەناهەندەکانی سەردەمی جیابوونەوە لە نیمچە کیشوەری هیندی ساڵی

دابەشبوونی ولات بگرێت بۆ دوو حکومەتی هیندستان و پاکستان. لەم کتێبە بچوکەدا چاوێك دەگێڕین بە ناو ڕوداوەکانی ١٩١٩—١٩٤٧، سەربەخۆیی هیندستان، دابەشبوونی ولات وبەشێکیش لە ژیانی گاندی.

## ژیانی لاوێتی گاندی

موهانداس کەرمچاند گاندی لە ساڵی ١٨٦٩ لە پارێزگایەکی بچوك بە ناوی *پوربەندار* لە دایك بووە کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای هیندستان. ئەو لە خێزانێکی مامناوەند بوو کە نە زۆر دەوڵەمەند بوون نە هەژاریش بوون. باوکی گاندی سەرۆك وەزیرانی سێ پارێزگای بچوك بوو. گاندی لە ژیانێکی نەریتی هیندووەکاندا گەورە بوو. گاندی لە تەمەنی ١٣ ساڵیدا ژیانی هاوسەرگیری پێکهێنا. لە ساڵی ١٨٨٨ بڕیاریدا بچێت بۆ *ئینگلتەرا* بۆ خوێندنی یاسا. لەوێدا گاندی بۆ ماوەی سێ ساڵ ژیانی تەنهای بەسەربرد، ژیانێکی خۆشبەختانەی نەبوو لە لەندەن. بەڵام توانی خوێندنەکەی تەواو بکات و وەکو پارێزەرێك بگەڕێتەوە هیندستان. بەڵام هەستی کرد لەوێشدا سەرکەتوو و نابێت و لە گەڵ بارودۆخەکە نەدەگونجا بۆ کارکردن. دواتر لە ساڵی١٨٩٣ بە شێوەیەکی کاتی لە *باشوری ئەفریقا* کاری دەستکەوت، لەوێدا ژمارەیەك هاوڵاتی هیندی دەژیان. گاندی لە باشووری ئەفریقا بوو کە کاری سیاسی دەستپێکرد.




ئەو خانوەی کە گاندی تێیدا لە دایك بوو



گاندی وەکو خوێندکار لە لەندەن

## گاندی لە باشوری ئەفریقا: ساتیاگراها

گاندی هەر زۆر زوو هەستی بەوە کرد کە باشوری ئەفریقا ولاتێکە سپی پێستەکان بەڕێوەی دەبەن" ڕەش پێست و سوورپێستەکان بە پلە دوو ئەژمار دەکران. گاندی هەوڵی دامەزراندنی ڕێکخراوێکی دا بۆ ئەوەی هیندییەکانی باشوری ئەفریقا ڕووبەڕوی حکومەت ببنەوە کە دەیانویست بارودۆخی خەڵك بەرەو ئاراستەیەکی دژوارتر بەرن... بەڵام چۆن دەیتوانی ئەوکارە بکات؟ چونکە ناوچەی هیندیەکان ناوچەیەکی بچوك بوو بە ڕواڵەت کارێکی ئەستەم دەهاتە پێش چاو، گاندی جەنگی ڕەد کردەوە. ئەو ڕێگای توندوتیژی بەلاوە پەسەند نەبوو.

گاندی چەند ساڵێکی تەمەنی خۆی تەرەخان کرد بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك، لە کۆتایدا لە ساڵی ١٩٠٧ توانی بگاتە ئەنجامێك. وڵامەکەشی "ساتیاگراها" بوو، بە واتای(هێزی حەقیقەت) زۆربەی خەڵك پێی دەڵێن خەباتی ناتوندوتیژی، گەرچی گاندی هەمیشە دەیوت ساتیاگراها مانایەکی جیاوازی هەیە. ئەو دەیوت خەباتی ناتوندوتیژی کە خەڵك لێی تێگەشتوون

بریتییە لە چەکی بێتوانایی مرۆڤ، ئەوان ئەم ڕێگەیە بەکاردێنن چونکە هیچ توانایی جەنگ یا خود چەکیان لەبەردەست نییە. ساتیاگراها، بە دیویکی دیکە بە مانای ئەوە دەهات کە چەکێکی بەهێزی مرۆڤە کە هەڵیدەبژێرێت چونکە ئەم ڕێگەیەی پێ باشترە لە جەنگ کردن. بەکارهێنانی ساتیاگراها ، وات ایدەکات قەناعەت بە دوژمنەکەت بهێنیت کە ئەوەی تۆ دەیڵێی. نیشانی دەدەیت کە تۆ ئامادەی زەجر و ناخۆشی بکێشیت بۆ ئەوەی خۆڕاگربیت لە سەر باوەڕەکەت، کە ئەمە زۆر گرنگە بۆ خۆش ویستنی دوژمنەکەت.

گاندی بەردەوامی بە ڕیچگەکەی خۆیدا لە باشوری ئەفریقا تا ئەو کاتەی لە ساڵی ١٩١٤ ئەوێی جێهێشت. گەرچی ئەو لەوێ هەندێ سەرکەوتنی بەدەستهێنا بەڵام جیاوازی ڕەگەزی هەر بەردەوام بوو. گاندی لە باشووری ئەفریقا تەجروبەی زۆری بینیبوو لەو ڕێگای خەبات کردنەی بۆ ماوەیەك پەیڕەوی دەکرد و کاتێك گەڕایەوە هیندستان بەردەوامی بە ڕێگاکەی دا. ئەو کاتێك چوو بۆ باشوری ئەفریقا کەسیکی کەم ئەزموون بوو لەو بارەوە بەڵام کاتێك گەڕایەوە بۆ هیندستان کەسیکی بە ئەزموونی لێدەرچوبوو، سەرکردەیەکی سیاسی سەرکەوتوو.



کەلوپەلەکانی گاندی

**ژووری گاندی لە ئەشرەم لە گوندی سیڤاگرام**

کەسێکی سەرکەوتوو بوو کە دەیزانی چلۆن هێزێك دروست بکات، چۆن گفتگۆ و کۆبوونەوە بکات لە گەڵ حکومەتەکان. گاندی بۆ شوێنکەوتووەکانی زیاتر لە کەسێکی سیاسی بوو: کەسێك زاڵ بوو بە سەر نەفسیەتی خۆیدا. بەشێوەیەکی زۆر سادە و خاکی دەژیا، خۆشەویستی ئەو بۆ هەژاران و پێداگری بۆ خۆڕاگری لەسەر باوەڕەکەی، هەموو ئەمانە وایان لە خەڵك کردبوو کە وەك کەسێکی پیرۆز لێی بڕوانن. گاندی لەو ڕووەوە پیرۆز بوو کە توانی شوێنکەوتوو بۆ خۆیی دروست بکات، سیاسەتمەدارێك بوو ئەو کاتەی توانی بە هاوکاری شوێنکەوتوانی بەرهەمێکی هەبێت.

گاندی کەسێك بوو زۆر جار ئاسان نەبوو لە گەڵی بسازێی بۆیە زۆرجار خەڵك گلەییان لەوە هەبوو کە گاندی زۆربەی کاتەکان بۆ هەر شتێك بەڵگەی ئایینی دێنێتەوە کە ئەوەش هاوکاری سیاسیانە بوو بۆ گاندی.

## گاندی دەگەڕێتەوە بۆ هیندستان

گاندی لە ساڵی ١٩١٥ گەڕایەوە بۆ هیندستان. بۆ ماوەیەکی کەم خۆی لە سیاسەت وەرنەدا. ئەوکاتەی گاندی لە باشوری ئەفریقا بوو لە گەڵ شوێنکەوتوانی شوێنێکیان بۆ خۆیان دەستەبەر کردبوو کە لەوێدا ژیانێکی زۆر سادەیان بەسەردەبرد، دەیانخوێند، کاریاندەکرد و دوعایان دەکرد.



ئامێری ڕستن (گاندی لە کاتی خۆپیشاندن)

لە هیندستانیش شوێنێکی دەستەبەر کرد (ئاشرام) کە لەوێدا گاندی و شوێنکەوتوانی دانەوێڵەیان دەڕواند، خۆراکیان دروست دەکرد، جلوبەرگی خۆیان دروست دەکرد. کاری چنین و ڕستن و دورینی جلوبەرگەکانیان بە دەستی خۆیان بوویە بەشێکی گرنگ لە پلان وبەرنامەی گاندی: گاندی خۆشی لە شارستانیەتی نوێی ئەوروپا نەدەهات بە هۆی شار و کارخانەی گەورەوە. ئەو پێی وابوو کە ئەمانە هەموو هەڵەن بۆ هیندستان. ئەو بۆچوونی وا بوو کە هیندستان وڵاتێك بێت لە شێوەی لادێیەك کە خەڵکی ژیانێکی سادەو خاکییان هەبێت و شاناویش بەو ژیانەوە بکەن. پلانە ئابووریەکانی گاندی لە ساڵانی دواتر کاریگەری بە هێزیان هەبوو، بەڵام لە کۆتاییدا هیندستانیش ڕێگای هاوشێوەی ئەوروپای هەڵبژارد. ئەو لە خێڵەکەی خۆیدا هەوڵی ئەوەی دەدا کە پلانەکەی ڕێفرۆمی کۆمەڵایەتیش بگرێتەوە. ئامانجی ئەو لەم ڕیفۆرمەدا سیستەمی قەبیلەی هیندووەکان نەبوو، بەڵام ئەو خۆشی لەوە نەدەهات کە جیاوازی بکرێت لە نێوان قەبیلە هیندووەکاندا، کە قەبیلە ئاست بەرزەکان زۆر جار بێ بایەخانە دەیانڕوانیە قەبیلە ئاست نزمەکان کە دەیانووت نابێ لەم جۆرە کەسانە نزیك ببنەوە. گاندی، بۆخۆی خەڵکی (بانیا) بوو یان تایفەی (بازرگان و کاسبکاران) ئەو ڕێگر بوو لەوەی لە *ئاشرام* ئەم جیاوازییە پەیڕەو بکرێت. دووبارە ئەم نموونەیەش کاریگەریەکی گەورەی هەبوو.

## گاندی و سەرەتای کاری سیاسی لە هیندستان

لە ساڵی ١٩١٧ گاندی دەستی کرد بە چالاکی سیاسی لە هیندستان. سەرەتای دەستپێکی کارەکانی لە سەرەوە نەبوو، واتە گفتوگۆی لەسەر ئەو شتانە نەدەکرد کە پێویستە حکومەت بیانگرێتە بەر. بۆنموونە لە (چامپاران) لە پارێزگای *بیهار*، گاندی پشتیوانی لەو

لادێنشینانە دەکرد کە لە دژی ئاغاکانیان وەستا بوونەوە. کاتێ دەستووریان پێدا کە ئەو ناوچەیە جێبهێڵێت چونکە بۆتە هۆی نانەوەی ئاژاوە، گاندی ڕەتی کردەوە ووتی من ئامادەم ئەشکەنجەو ئازار بکێشم. گاندی سەرکەوت: حکومەت پاشگەز بوویەوە لەوەی کە ئەو ناوچەکە جێ بهێڵێت و ئامادەی نیشان دا بۆ هاوکاری لادێنشینەکان.

گاندی لە ساڵی ١٩١٨ جارێکی دیکە هەوڵی دژایەتی دایەوە بەڵام ئەمجارەیان لە شاری (خیدا) لە پارێزگای (گوجرات). جارێکی دیکە ڕێگای ساتیاگراهای بەکارهێناوە، گەرچی ئەو نەیتوانی هەموو داواکارەکانی لادێنشینەکان دەستەبەربکات بۆیان بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا هەندێ سەرکەوتنی بەدەستهێنا. گاندی چوویە پاڵ ئەو کرێکارانەی کە لە کارخانەی پەموو کاریان دەکرد، کارگەیەکی گەورە بوو لە *ئەحمەدئاباد*. گاندی دەستی کرد بە مانگرتن لە خواردن تا ئەو کاتەی خاوەن کارگەکان داواکاری کرێکارەکان بەجێبهێنن. تا ڕادەیەك ئەم هەوڵ وتەقەلایەی گاندی ڕێکەوتنێکی بە دوای خۆیدا هێنا.

لە چامپاران، خیدا وئەحمەدئاباد گاندی شتێکی نوێی هێنایە ناو سیاسەتی هیندستانەوە. هەتا ئەوکاتەش خەڵکی چینی ناوەڕاستی هیندستان پەیوەندیەکی کەمیان لە گەڵ خەڵی ئاسایی هەبوو و حکومەتی بەریتانیاش بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە خەڵکی ئاسایی یان خەڵکی گوندەکان وکرێکارەکان زۆر گرنگی بە بابەتی نەتەوایەتی نادەن.

جوتیارێکی هیندی






هیندستانی سەردەمی گاندی

ئێستا گاندی ئەوەی نیشان دابوو کە ئەم خەڵکە ئاساییە و کرێکارانە بوونەتە شوێنکەتووی ئەو و دەیهەوێ ڕێکیان بخات وەکوو بزوتنەوەیەکی گەورە. گاندی بە هۆی ئەوەی ڕێگاکانی نەریتی هیندۆسی بەکاردەهێنا، لەناو خەڵکی ئاسایی کەسێکی ناسراو بوو. بەڵام سیاسەتمەدارانی ئاست مامناوەند ڕەقیان لەم کارانە دەبوویەوە و هەتا جلوبەرگی بەریتانیەکانیان دەپۆشی، بەڵام گاندی هەر بەوجلوبەرگە ئاساییەی خۆی خۆشەویست بوو لە ناو خەڵکدا.

نەتەوەگەری لە ژێر سەرکردایەتی گاندی ببووە بزوتنەوەیەکی گەورە. هەروەها گاندیش ئەوەی نیشان دابوو کە ئەو مێتۆدانە یاخود ئەو ڕێگایانەی گرتبوونیە بەر کاریگەربوونە" حکومەت، ئاغاکان و خاوەن کارگەکانیش تاڕادەیەك ناچاربوون ڕێگای بۆ چۆڵبکەن. ئەو دەیزانی تا چ ئاستێك خەڵك هان بدات و کەی ڕێگایان لێبگرێت و قەناعەتیان پێ بێنێت. زۆرێك لە گەنجان، کە بێزار ببون لە سەبر بەڕێوەچوونی کاروباری سیاسەتی هیندستان، بڕیاریان دا کە پشتگیری ئەم پیاوە نوێیە بکەن. لە نێوان ئەم کەسانەدا، دووکەس کە دواتر بوون بە کەسانی پلە باڵا بریتی بوون لە: جەواهر لەعل نەهرۆ(١٨٨٩ــــ١٩٦٤) کە دواتر بوویەوە هەوەڵین سەرۆکوەزیرانی هیندستان، و

سەردار ڤالابای پاتیل(١٨٧٥—١٩٥٠) کەسی سەرەکی بوو لە دامەزراندنی (حیزبی کۆنگرێسی نەتەوەیی هیندستان) کە لە ساڵی ١٨٨٥ بونیادنرا. ئەو دووانە تەواو کەسانی جیاواز بوون، نەهرۆ کەسیکی زیرەك بوو زیاتر کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەوروپا بەڵام پاتیل تەواو کەسیکی هیندی بوو. یەکێك لە خاڵە هەرە گرنگەکانی گاندی تواناى ایك جیا کردنەوەی ئەو هەموو خەڵکە جیاوازانە بوو و هەمووانی پیکەوە کۆدەکردەوە کە هاوکاری یەکترین.

## سیاسەتی هیندستان لە ساڵی ١٩١٩

گەشەی ناسیۆنالیستی هیندستان لە ساڵی ١٩١٧ کە کتێبێکی دیکەی بچوکە لەم زنجیرەیەدا باسکراوە بە ناوی(ڕاجی بەریتانیا و ناسیۆنالیستی هیندستان). لە ساڵی ١٩١٩ سەرانی هیندستان لە هەوڵی حکومەتیکی خۆبەڕێوەبەریدابوون بۆ داهاتویەکی نزیك، بەڵام هێشتا زۆرێك لە بەریتانیەکان ڕازی نەبوون دەست لە هیندستان هەڵگرن. هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە زۆر هەلی کاریان لە دەست دەدا، شکۆیان لە دەستدەدا و هەروەها لەوانەبوو ببوایە هۆی لە دەستدانی بازرگانی و سەرمایەگوزاریش. بەڵام بەریتانیا لە کۆتاییدا قەولی حکومەتیکی خۆبەڕێوەبەری پێدان بەڵام نەیوت کەی.

جەستەی کوژراوی پۆلیس لە خۆپیشاندانەکانی ١٩١٩



لەجیاتی ئەوە قەولیان دا کە ئەم سەربەخۆیە قۆناغ بە قۆناغ بێت تا ئەو کاتەی خۆیان(بەریتانیا) پێیان وایە کاتەکەی گونجاوە. لە ساڵی ١٩١٩ دەرفەتێکی باش هاتە پێشەوە بۆ هیندستانیەکان لە بواری حکومەتداریدا، بەتایبەت بۆ پارێزگاکان. بەڵام هەر لەوکاتەدا حکومەتی بەریتانی لە هیندستان، نیگەران بوون بە هۆی ئەو نائارامیەکان لەو وڵاتەدا. بە هۆی یاسایەکی نوێ بە ناوی (ڕۆڵات) حکومەت دەسەڵاتێکی زیاتری پێدرا بۆ سەرکوب کردنی خەڵکی ناڕازی.

## کۆمەڵکوژییەکەی ئامریستار

گاندی بڕیاریدا لە دژی یاسای(ڕولات) بوەستێتەوە و شوێنکەوتووەکانیشی بانگ کرد بۆ مانگرتنی یەك ڕۆژەی سەرتاسەری لە (هاوتاڵ). ئەو وایزانی کە مانگرتنەکە بە شێوەیەکی ئاشتیانە دەبێت، شوێنکەتوانی بە شێوەیەکی ئاشتیانە ئەو یاسا نوێیە دەشکێنن. بەڵام بزوتنەوەکە لە دەست دەرچوو و بوو بە ئاژاوە و خوێنڕێژی. گاندی گوتی کە هەڵەی کردووە سەبارەت بە خەڵك لەوەی کە ئامادە بن بۆ ساتیاگراها" ئەوان توانای کۆنترۆڵکردنی خۆیان لە دەستدابوو کە شتێکی زۆر زەروری بوو. گاندی بزوتنەوەکەی هەڵپەسارد بەڵام درەنگ بوو بۆ ئەوەی ڕێگیری بکرێت لە تراژیدیایەکی گەورە لە ئامریستار لە پونجاب. لەوێدا پۆلیس کۆنترۆڵی لە دەستدا و سوپا هاتە پێشەوە بۆ ئەوەی باروودۆخەکە هێور بکاتەوە. لە ١٣ی چوار فەرماندە *دییەر* دەستووری بە لەشکرەکەی خۆیدا کە تەقە لە خەڵکەکە بکەن لە مەیدانەکە. ٣٧٩ نەفەر کوژران و زیاتر لە ١٠٠٠ کەس بریندار بوون. دواتر *دییەر* یاسایەکی سوکایەتی کردنی پەیڕەو کرد دژ بە هیندووەکان. ( جارێك یەك لە هیندیەکانی ناچار کردبووە بە سینگەخشە بڕوات لەبەرئەوەی لەوێدا هێرش کرابووە سەر ڕۆحانیەکیان). ڕەفتار و کردارەکانی ڕییەر کاریگەری هەبوو و بووە هۆی ناڕەزایی ڕۆشنبیرانی هیندستانی، ئەمە ئەوەی نیشان دەدا کە یاساکانی بەریتانی بێرحەم و ڕەگەزپەرەستانەیە. دواتر خەڵکەکە لە پشت سەری گاندیەوە ڕیزیان بەستەوە، گاندی هێشتا ڕێبەری سەرەکی هیندیەکان بوو.

## بزوتنەوەی خەلیفە و بزوتنەوەی دژەهاوکاری

ئێستا گاندی دەیەوێت ئەم جەنگەی دژ بە بەریتانیەکان تەواو بکات ئەویش بە هاوکاری موسڵمانەکان، کە ئەوان هێشتا گومانیان لە ڕێبەرایەتی حیزبی کۆنگرێس هەبوو کە هیندوەکان تێیدا باڵادەست بوون. لەوکاتەدا زۆرێك لە موسڵمانەکانی هیندستان نیگەران بوون لە سیاسەتی بەریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەوان ڕێز وئیحترامێکی زۆریان هەبوو بۆ خەلافەتی عوسمانی و خودی خەلیفەش وەکوو فەرمانڕەوای سەرەکی موسڵمانەکان لە جیها ندا.




**خۆپیشاندانی ناسیۆنالیستە هیندیەکان دژ بە کۆمسیۆنی سیمۆنی بەریتانی ١٩٢٩**

بەریتانیا هەوڵی ئەوەیدەدا کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەبەریەك هەڵوەشێنێت کە لە جەنگی یەکەمی جیهانی شکستی خواردبوو. گاندی پێی وابوو کە ئەگەر کۆنگرێس پشتیوانی موسڵمانە هیندیەکان بکات کە دەیانەوێت ئیمپراتۆریەتی عوسمانی چارەبکەن، ئەوا موسڵمانەکان پەیوەندی دەکەن بە کۆنگرێسەوە لە چالاکی دژی بەریتانییەکان لە هیندستان.

گاندی دەیویست کە هەردولا واتە موسڵمانەکان و هیندوەکان دەبێ هاوکاری لە گەڵ بەریتانیەکان رەدبکەنەوە. بزوتنەوەیەکی *دژە هاوکاری* پێکهات تا ئەوکاتەی سیاسەتی بەریتانیا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست گۆڕانکاری بەسەربێت. هاوکات زۆرێك لە نوێنەرانی قەدیمی کۆنگرێس لە دژی گاندی وەستانەوە. لە ساڵی ١٩٢٠ لە *ناکپوور* بیرۆکەکانی لە گەڵ حیزبی کۆنگرێس خستە ڕوو و پەسەندکرا. ئەم بیرۆکانە بزوتنەوەی دژەهاوکاری لەگەڵ بەریتانیەکان لە خۆگرتبوو، کە سیستەمێکی نوێ بوو بۆ ڕێکخراوێکی گرنگ لە کۆنگرێس دەیویست ڕێکخستنێك بکات بۆ ئەو ناوچانەی کە بە هەمان زمان قسە دەکەن و جلەکانیان بە دەستی خۆیان دروست دەکەن.



گاندی لە ڕێ پێوانی خوێ ١٩٣٠

کۆنگریس بە تەواوی گۆڕانکاری بە خۆیەوە بینیبوو لە ژێر کاریگەری گاندی. لەمەودوا شتێکی جیاواز دەبینرا: پیاوانی کۆنگریس ئەو جلانەیان لەبەردەکرد کە بەدەست دروستکرابوون. گاندی دەستی کرد بە دروستکردنی حیزبێکی سیاسی گەورە و باش لە ئاسیادا. زۆر جالبە ئەگەر بەراوەرد بکرێت لە نێوان حیزبی کۆنگرێسی نیشتمانی هیندستان لە گەڵ حیزبی نیشتمانی خەڵك لە چین و حیزبی کۆمونیستی چین.

گاندی سەرەڕای سەرکەوتنەکانی، بەڵام هێشتا ڕێگەی درێژی لەبەردەمدا بوو کە بیبڕێ. بزوتنەوەی دژەهاوکاری لەناوچوو و هاوپەیمانی موسڵمانەکانی هیندیش شکستی هێنا. جەنگ لە نێوان ئەم دوو گروپە بەرپا بوو و ڕێگەی توندوتیژیان گرتە بەر دژی حکومەت. لە مانگی سێی ١٩٢٢ گاندی دەستبەسەرکرا. ئەو دانی نا بەوەی کە هۆکاربووە خەڵك دژ بە حکومەت بوەستنەوە و دادگا بڕیاری شەش ساڵ زیندانی بۆ دەرکرد، بەڵام ئەو دوای دوو ساڵ ئازادکرا. بۆ ماوەیەك سیاسەتەکانی بۆ کەسانی دیکە بەجێهێشت دواتر گەڕایەوە بۆ سەر پلان و بەرنامەکانی خۆی کە ڕیفۆرمی کۆمەڵایەتی و ئابووری بوو.

## گوێڕایەڵ نەبوونی خەڵکی مەدەنی

گاندی لە ساڵی ١٩٢٩ گەڕایەوە ناو سیاسەت کە لە کاتێکی قەیراناویدا بوو. حکومەتی بەریتانیا لیکۆڵینەوەی لە قۆناغەکانی داهاتووی سەربەخۆیی هیندستان دەکرد بۆ ئەوەی کۆمسیۆنی لێ ئاگاداربکاتەوە. کۆنگرێس داوای هەرچی زوو حکومەتێکی خۆبەڕێوەبەری دەکرد. نائیب سەلتەنە و فەرمانڕوا *ئیروین* پێشنیاریان کرد ڕێکەوتنامەیەك بکەن. بەریتانیا و سەرانی هیندستان کۆنفرانسێك



## پارێزگاری کردن له خوێ

سازبکه‌ن بۆ بڕیاردان له‌وه‌ی که هیندستان چۆن بتوانێ به‌رو پێش بڕوات به‌ره‌و حکومه‌تیکی سه‌ربه‌خۆ. کۆنگرێس بیروڕای جیاوازی تیکه‌وت: هه‌ندێك ده‌یانویست پێشنیاره‌که په‌سه‌ند بکه‌ن" ئه‌وانی دیکه پێداگریان ده‌کرد له‌سه‌ر سه‌ربه‌خویی یه‌کجاری و به بێ هیچ دواکه‌وتنێك. گاندی هاوڕا بوو له گه‌ڵ گروپی دووه‌م و ده‌ستی کرد به دامه‌زراندنی که‌مپینیکی نوێ بۆ شکاندنی یاساکان، یان خه‌ڵکی مه‌ده‌نی گوێڕایه‌ڵ نه‌بن بۆ حکومه‌تی به‌ریتانی. واتا دژایه‌تی کردنی له گه‌ڵ حکومه‌ت، شکاندنی یاسای خوێ بوو.

## ڕێ پێوان بۆ خوێ

گاندی بۆیه ده‌ستی کرد به سه‌رپێچی کردنی یاساکان چونکه ئه‌م یاسایانه لای خه‌ڵکی ناڕه‌زایه‌تیه‌کی زۆری لیکه‌وته‌وه. هه‌موو که‌س، ده‌وڵه‌مه‌ند و هه‌ژار ده‌بوایه خوێ بکڕن، به‌ڵام ئه‌وانه‌ی خوێیان دروست ده‌کرد له ژێر ده‌سه‌ڵاتی حکومه‌ت بوون که بازرگانیان پێوه ده‌کرد. خه‌ڵك ڕیگه‌یان پێنه‌ده‌درا که بۆ خۆیان خوێ به‌رهه‌م بێنن. هه‌روه‌ها گاندی له‌وه دڵنیا بوو که ئه‌گه‌ر ڕاگه‌یاندنی سه‌رتاسه‌ری بکرێت دژ به‌م یاسایه ئه‌وا سه‌رکه‌وتن به‌ده‌ست دێنن. له ١٩٣٠/٣/١٣ ئه‌و ڕێگه‌یه‌کی دۆزیه‌وه، ئه‌ویش ڕێ پێوانێك بوو که ٢٤٠ میل ببڕن بۆ که‌نار ده‌ریا که خوێی لێ که‌ڵه‌که ببوو. ئه‌م شته ده‌نگدانه‌وه‌یه‌کی سه‌رتاسه‌ری لیکه‌وته‌وه له هیندستان. له ٦/٤ ئه‌وگه‌یشته ده‌ریا له *داندی* و که‌مێ خوێی له که‌نار ده‌ریا هه‌ڵگرت. زۆر به خێرایی، هه‌موو خه‌ڵکی هیندستان ده‌ستیان کرد به دروست کردنی خوێ. حکومه‌ت له سه‌ره‌تادا هه‌وڵی دا که چاوپۆشی بکات له‌و شته‌ی ڕوویدابوو به‌ڵام، له کۆتاییدا ناچار بوو که توندوتیژی ڕابگرێ وه‌ك هه‌میشه هاوڕا بێت که چی

ڕوودەدات لە گەڵ بزوتنەوەیەکی ئاشتیخواز. ساتیاگراهای گاندی زۆرجار دەبووە هۆی خوێنڕشتن. بەریتانیا ووتی ئەو واتە گاندی دەبێ ئەوە بزانێ کە ئەو ڕاستگۆ نیە لەوەی خوی وانیشان دەدات کە ئەو کارەی نەکردووە. لە مانگی پێنج گاندی دیسان دەستگیرکرایەوە، هەر زۆر زوو سەرانی کۆنگرێس دەستگیرانەوە و کۆنگرێس داخرا.

## لە دەوری مێزی کۆنفرانس

کێشەی بەریتانیا ئەوە بوو گەرچی دەیانزانی کە بۆیان سەختە کار لە گەڵ گاندی بکەن بەلام ئەوەشیان دەزانی بە بێ گاندیش هیچیان بۆناکرێت، چونکە ئەو کاریگەریەکی زۆری هەبوو لە هیندستان. ١٩٣١/١ *ئیروین* ڕێگەی دا گاندی لە گرتووخانە بێتە دەرێ و هەردوکیان پێکەوە گفتوگۆیەکیان کرد.

گاندی ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر کۆتایی هێنان بە کەمپینی نافەرمانی مەدەنی ودواتر چوو بۆ لەندەن وەکوو سەرۆکی کۆنگرێس لە دەوری مێزی کۆنفرانس کۆبونەوەی کرد. بەلام لە لەندەن هیچ ڕێکەوتنێك نەکرا: لە گفتوگۆیەکەدا نە شازادەی هیندستان، موسڵمانەکان و نە خەڵکە ئاست نزمەکانیش ڕەزامەندیان نیشان نەدا بۆ پێشنیارەکانی گاندی و دواتر گاندی گەڕایەوە هیندستان. لە ١٩٣٢/١٢ دووبارە حکومەت و کۆنگرێس کەوتنە کێشمەکێشم. لە ١٩٣٢/١/٤ گاندی دووبارە دەستگیرکرایەوە. ئەمجارە حکومەت ڕێگەی سەختری گرتە بەر و کۆنگرێس دووبارە شکستی هێناوە و کەمپەینی نافەرمانی مەدەنی شکستی هێنا. گاندی گەڕایەوە سەر کارەکانی پێشووی: ڕێفۆرمی کۆمەلایەتی و ئابووری، نەهێشتنی جیاوازی تەبەقایەتی و کاری دەستی لە لادێ. هەر لە کاتەشدا حکومەتی بەریتانیا بە پلان و بەرنامەی خۆی دەچووە پێشەوە بۆ حکومەتی هیندستان.

حکومەتی هیندستان لە ساڵی ١٩٣٥ سەربەخۆی دابوو بە پارێزگاکان بە شێوەی هێزێکی بەرچاو لە حکومەتی ناوەندی هیندستان. کۆنگرێس بڕیاری لەبارەی یاسا نوێیەکەوە دەرکرد. حکومەتی بەریتانیا هەموو داواکاریەکانی هیندستانی جێبەجێ نەکرد بەلام دەرفەتێکی باشی دانێ و ئەگەر ئەوان ئەم دەرفەتەیان ڕەدکردبایەوە ئەوا هەندێ حیزب ولایەنی دیکە لێی سوودمەند دەبوون لە جیاتی ئەوان. لە کۆتاییدا کۆنگرێس بڕیاریدا بۆ بەژداریکردن لە هەڵبژاردن بۆ حکومەتی نوێی پارێزگاکان لە ساڵی ١٩٣٧، زۆربەیان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. کۆنگرەی حکومەت لە حەوت پارێزگا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، هەڵبەت لە هیندستانی ژێر دەسەلاتی بەریتانیا. گاندی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بژداری لەم هەڵبژاردنەدا نەکرد، دەڵێن ئەو وازی لە سیاسەت هێنابوو و ئارەزووی تەنها لە کاری ڕێفۆرمی کۆمەلایەتی و ئابووری هەبوو. بەلام ئەو هێشتا لە پشت پەردەوە ڕێبەرایەتی کۆنگرێسی دەکرد، و ڕاگرتنی هاوسەنگی لە نێوان گروپە جیاوازەکانی ناوخۆی کۆنگرێس.



موحەمەد عەلی جیناح، بونیادنەری پاکستان

## پاکستان

سەرکەوتنی کۆنگرێس لە ساڵی ١٩٣٧ نیگەرانی لای موسڵمانەکانی هیندستان دروست کرد. هیندۆسەکان و موسڵمانەکان بە شێوەیەکی بەردەوام لە ئاکۆکی و جەنگدا بوون. بەڵام موسڵمانەکان دڵنیا نەبوون کە چی بکەن و دابەش کرابوون بۆ ژمارەیەکی زۆر حیزب. لە دوای ساڵی ١٩٣٧ زۆربەی موسڵمانەکان بزوتنەوەیەکی یەکگرتوویان پێکهێنا، کە موحەمەد علی جیناح(١٨٧٦—١٩٤٨) ڕێبەرایەتی دەکرد. جیناح خۆی جارێك پشتیوانی کۆنگرێسی کردبوو و هەوڵی یەکگرتووی هیندوەکان موسڵمانەکانی دابوو، بەڵام دواتر خۆشی لەو ڕێگەیە نەهات کە کۆنگرێس گرتبویە بەر کە خەریك بوو بەرفراوانتر دەبوو. ئێستا ئەو ببوە ڕێبەری موسڵمانەکانی هیندستان دژ بە هیندوەکانی ژێر دەسەلاتی کۆنگرێس. لە ساڵی ١٩٤٠ بزوتنەوەی موسڵمانەکان وەکو حیزبێکی سیاسی و سەربەخۆ داوای حکومەتێکی جیایان بۆ خۆیان دەکرد کە پێی دەوترا پاکستان. گاندی زۆر بێزار و نیگەران بوو لە بیرۆکەی لەت بوونی هیندستان، بەڵام وا دەهاتە پێش چاو کە ئەو شکڵ و سیمایەی گاندی دابووی بە کۆنگرێس جێگای موسڵمانەکانی تێدا نەدەبووەوە.

## جێهێشتنی هیندستان

لە ساڵی ١٩٣٩ جەنگی جیهانی دووەم دەستی پێکرد. ژاپۆن لە ساڵی ١٩٤١ هاتە ناو جەنگەکەوە وهەڕەشەی داگیرکردنی هیندستانی کرد. بەریتانیا دەیویست بە هەموو شێوەیەك پشتگیری هیندستان بکات لە هەر هێرشێکی ژاپۆن و ئەویش بە هۆی پێشنیارێکی نوێ کە بەریتانیا بە هیندستانی دەوت: زۆر بە زووی لە دوای جەنگ ئازادی بە دەست دێنن. گاندی ووتی: نەخێر: دەبێ یەکسەر ئازادی بەدەستبهێنین. گاندی بەرەنگاربونەوەیەکی دیکەی دژی هێزی بەریتانیا دەست پێکرد بۆ ئەوەی هیندستان جێبهێڵن. دەیووت: "من ئازادیم دەوێ هەرچی زووە" دەیووت: "هەر ئەم شەو بەرلەوەی ڕۆژبێتەوە" بەڵان ڕووبەڕوبونەوەکە شکستی هێنا. گاندی و ڕێبەرەکانی دیکە خرانە زیندانەکانەوە. دەرئەنجامیش ئەوە بوو کە موسڵمانەکان تەقویەت بکرێن ئەوانەی پشتیوانی بەریتانیان دەکرد زۆرێك لە موحافەزەکارەکانی بەریتانیا داوای لێبوردنیان نەکرد بەوەی کە بەڵێنەکەیان شکاند لەوەی هیندستان ئازادی بەدەستبهێنێت.



گاندی و پاتاڵ

## دابەشکردن و سەربەخۆیی

لە کۆتایەکانی جەنگدا بوو کە بەریتانیا لە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکانی هیندستاندا بوو. لە بەریتانیا حیزبی کریکاران زۆری پێی خۆش بوو کە هیندستان سەربەخۆی بەدەست بێنێت. ئێستا پرسیاری سەرەکی ئەوبوو کە هیندستان دەیهەویٚ وەکو یەك حکومەت سەربەخۆیی وەربگرێت یان دوو حکومەت؟ گاندی وسەرانی کۆنگرێس بێزار و نیگەران بوون لە بیرۆکەی دابەش بوونی هیندستان و هەروەها بەریتانیاش ئەوەی نەدەویست. بەڵام جیناح و موسڵمانەکان پێداگریان کرد تا ئەوەی لە کۆتایدا کۆنگرێس ڕەزامەندی دەربڕی کە هیندستان دابەش بکرێت بۆ دوو وڵات هیندستان و پاکستان. گاندی لای خۆیەوە زۆر ناڕەحەت بوو لەم دابەشکردنە بەڵام نوێنەرانی کۆنی کۆنگرێس ئەمەیان بە تاکە ڕێگای چارەسەر لەقەڵەم دا. گاندی هێشتا گەورەترین و گرینگترین ناسیۆنالیست بوو بەڵام ئەو چیتر ڕێبەر نەبوو. کاتێك هیندستان و پاکستان سەربەخۆیان بە دەستهێنا لە ١٩٤٧/٨/١٥ نەهرۆ و پاتاڵ حکومەتی نوێی هیندستانیان گرتە دەست و جیناحیش بوو بە سەرۆکی پاکستان. حکومەتی شازادە دابەش کرابوو بۆ دوو حکومەت هەریەکەو بە پێی ناوچەکانی خۆیان، لەگەڵ ئەوەشدا هیندستان و پاکستان سەرکەوتوو نەبوون لە سەر ڕێکەوتنیان لە بارەی کشمیرەوە و دەستیان کرد بە جەنگ لەسەر ئەم ناوچەیە. هەردوو وڵات هیندستان و پاکستان دەستیان کرد بە بونیادنانی وڵاتە نوێیەکانیان. لە پاکستان کێشەی تایبەتی هەبوو چونکە ئەو وڵاتە لە دوو بەش پێکهاتبوو کە هەزاران

میل لەیەکترەوە دوربوون. لە ساڵی ١٩٧١ جەنگی ناوخۆ دەستی پێکرد کە ئەنجامەکەشی ئەوەبوو پاکستان بەشێکی لێ جیابوویەوە لە بەشی ڕۆژهەڵاتەکەی. وڵاتێکی نوێ پێکهات بە ناوی بەنگلادش.

## گاندی لە کۆتایی مانگەکانی ژیانیدا

گاندی لە حکومەتی نوێدا هیچ ڕۆڵێکی نەبوو. لە کۆتای مانگەکانی تەمەنیدا گاندی هەوڵی چارەسەرکردنی زامەکانی دابەشبوونەکەی دەدا و هەوڵی ڕێگریکردنی ئەو کوشتوکوشتارەی هیندووەکانی دەدا بەرامبەر موسڵمانەکان. لە *کەلکەتە* توانی بەر لە توندەتیژیەکان بگرێت. ئەو لە ساڵی ١٩٤٧ چوو بۆ دیهلی ولە ١٩٤٨/١/١٣ دەستی کرد بە ڕۆژووگرتن بۆ ماوەی هەفتەیەك بۆ ئەوەی قەناعەت بە هیندۆسەکان بێنێت کە لە گەڵ موسڵمانەکان باش بن. هەر ئەوەش بووە هۆی مردنی خۆی بە دەستی هیندۆسیەك.

## سیاسەتمەداری پیرۆز

لە هەموو شتێك گرنگتر ئەوەبوو، کە گاندی هەمیشە دەیووت خەڵك دەبێ لە گەڵ یەکتر باش بن، ئەو لە ژیانی کەسایەتی خۆی هەوڵی ئەوەی دا کە خەڵك چۆن دەبێ بژین. گاندی بۆ وەدەستهێنانی شوێنی خۆی لە مێژووی جیهان لەبەرئەوە نەبوو کە کەسێکی باش بوو، ڕاستیەکەی ئەو کەسێکی باش بوو لە ژیانی کەسایەتی خۆیدا، بەڵام ئەو ڕێبەرایەتی هیندستانی کرد تا سەربەخۆیی و ئازادی بەدەستهێنا. ئەوە ڕاستە کە زۆر کەس شوێنی دەکەوتن چونکە پێیان وابوو ئەو کەسێکی پیرۆزە، بەڵام ئەوە لێهاتویی و کارزانی خۆی بوو کە وەکوو سیاسەتمەدارێك توانی وزەو توانا لە خەڵەوە وەربگرێت بۆ وەدەستهێنانی ئامانجەکانی.

ئەوانەی دیکەش کە شوێن گاندی دەکەوتن نەك لەبەرئەوەی کە هاوڕابوون لە گەڵ بیرۆکەکانی، بگرە زۆرێك لە هیندیەکان هاوڕانەبوون لە گەڵ چاکسازیەکانی گاندی لە بواری کۆمەلایەتی و ئابووری، بەڵام ئەو زۆر زیرەك بوو لە بەدەستهێنانی ئامانجەکان. دەستکەوتی ڕاستەقینەی گاندی پاراستنی کۆنگرێس بوو تا ئەو شوێنەی توانی، هەرچەند کە ئەندامامی کۆنگرێس کەسانی ئێك جیاواز بوون بە ئامانجی جیاوازیشەوە. ژیانی سیاسی ژیانێکی ئاسان نییە بۆ کەسێکی وەکو گاندی کە بە پیرۆزیان دادەنا. ئەو زۆر شت هەبوو کە ناچار بوو بیکات بەڵام لە دڵەوە خوازیاری نەبوو. بەڵام ئەو سەربەخۆیی بۆ هیندستان وەرگرت کە بووە هۆی گۆڕینی هاوسەنگی لە هێزی جیهانی. سەربەخۆییەکەی هیندستان لەوانەیە گەورەترین ڕووداوبێت بۆ نیشانەی کۆتایی هێنان بە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی و سەرهەڵدانی جیهانی سێیەم.( بگەڕێوە بۆ کتێبی جەنگی سارد لەم زنجیەیەدا). بەڵام گاندی لە هەموو شتەکانی دەیویست بەدەستیان بێنێت سەرکەوتوو نەبوو. ئەو شکستی هێنا لە پاراستنی هیندستان بەیەك پارچەیی.



کارەکانی ستیلێ تاتا، جەمشیدپوور

لەوبارودۆخەدا شتێکی مەحاڵ بوو کە هیندووەکان وموسڵمانەکان بتوانن لە ژێر یەک حکومەتدا پێکەوە بحاوێنەوە، بەڵام گاندی هاوکار نەبوو بۆ بەدەستهێنانی دڵی موسڵمانەکان. لە ڕوانگەی موسڵمانەکانەوە گاندی تەنها نوێنەرایەتی هیندۆسەکانی دەکرد و پێداگریەکەی ئەو لەسەر هیندستانی یەک پارچە دەبووە هۆی مەترسی بۆ ئەوان.

ئەو هەروەها شکستی هێنا لەوەی ئەوانی دیکە قانع بکات لەسەرئەوەی کە بیرۆکەکانی ئەو بۆ داهاتویی هیندستان دروستن. ئەو دەیویست هیندستان وەکو لادێیەکی خۆژێ بێت" حکومەت دەبوایە خەڵکەکەی بەتەنیا جێ بهێڵێت و حیزبی کۆنگرێسیش دەبوایە زیاتر گرنگی بدات بە لایەنی پەروەردەو فێربوون و لایەتی کۆمەڵایەتی. . لە جیاتی ئەوە هیندستان بوو بە وڵاتێکی پیشەسازی، خەڵک لادێ کانیان جێهێشت و بۆ کارکردن ڕوویان کردە شارەکان. حکومەت دەسلاتیکی زیاتری بەدەستهێنا و حیزبی کۆنگرێسیش بوویە گەورەترین حیزب. لە دەستکەوتەکانی دیکەی گاندی نیشانی دا کە چۆن ڕووبەڕوبونەوەی سیاسی بکەن لە ڕێگای خەباتی ناتوندوتیژی(ساتیاگراها، گوێڕایەڵ نەبوونی خەڵکی مەدەنی بۆ حکومەتی بەریتانیا و بزوتنەوەی دژەهاوکاری). هیندستان ئاکە وڵاتی گەورەیە کە خەڵکەکەی لە جەنگی سەربەخۆیی سەرکەوتن لە ڕێگای شۆڕشێکی ئاشتیخوازانە. وبە ئاشتیانە ڕویان دەکردە زیندانەکان! مێتۆدەکەی گاندی کاری خۆی کرد دژ بە ئیبراڵ و دیموکراتخوازەکانی بەریتانیا. بەڵام هێشتا ڕوون نییە کە ئاخۆ ئەم مێتۆدەی گاندی لە وڵاتانی دیکەش سەرکەوتوو دەبێت لە کاتێکدا ئەو حکومەتانەی دیکە زۆر بێ بەزەیانە ڕەفتار دەکەن لە گەڵ ئەوانەی یاساکان پێشێل دەکەن؟

لە دوای مەرگی گاندی زۆر کەس هەوڵیان دا ئەو مێتۆدەی گاندی بەکاربهێنن لە بەشەکانی دیکەی جیهان. بۆنمونە داکۆکیکار لە مافەکانی مەدەنی مارتین لۆتەر کینگ لە نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. حکومەتە نوێیەکانی سەردەم پێویستیان بە هاوکاری و یەکگرتووی خەڵکەکەی هەیە، بۆیە خۆڕاگری وخەباتی ناتوندوتیژی(ساتیاگراها) و خۆپیشاندانی ئاشتیانە دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی هەندێ سەرکەوتن. بەڵام زۆربەی گروپ و لایەنەکان کە دەیانهەوێ گۆڕانکاری گەورە لە سیاسەتەدا بکەن هێشتا بە ڕێگای توندوتیژی شۆڕش دەکەن.